# چۆن...؟

## دەبیتە خۆشەویستی مێردەکەت.

١٠٠ ئامۆژگاری بۆ ئافرەتان.


کۆکردنەوە و وەرگێڕانی:

عبدالقهار بلباس





چاپی یەکەم - ٢٠٠٩

ناوی نامیلکە: چۆن دەبیتە خۆشەویستی

مێردەکەت..؟

سەرچاوە: ئینتەرنێت.

وەرگێڕانی بە دەستکاریەوە: عبدالقهار بلباس.

کۆمپیوتەر: وەرگێڕ.

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

ژمارەی سپاردن: 281

تیراژ: 2000 دانە

بۆ هەر ڕاو سەرنجێك دەتوانن پەیوەندی بکەن لە

ڕێگەی ئەم ئیمەیلەی خوارەوە:

qahar.1980@gmail.com

## پێشەکی:

× هەموو ئەو کچانەی کە دەیانەوێت ژیانی هاوسەری پێک بهێنن .

× هەموو ئەو ئافرەتانەی کە دەیانەوێت دڵی مێردەکانیان لە خۆیان ڕازی بکەن.

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# دەستپێک

خوای گەورە بۆ بەردەوامی ژیان هەموو دروستکراوێکی خۆی لە دوو ڕەگەزی نێر و مێ هێناوەتە بوون. کەواتە دەبێت هەماهەنگی و پێکەوە ژیانێکی وا لە نێوان ئەم دوو جەمسەرە جیاوازە هەبێت کە بەردەوام بوونیان سوودی هەبێت بۆ دەورووبەر نەک زیان.

ئادەمیزادیش بە هەمان شێوە پێکهاتووە لە نێر و مێ کە دوای بەیەک گەیشتنی ئەم دوانە پێیان دەگوترێت (پیاو و ئافرەت). زۆر نووسراوە و باسکراوە لەسەر ئەو ڕێگایانەی کە ئەم دووانە بەرەو لووتکەی بەختەوەری دەبەن بە تایبەت ئەو مافانەی کە هەر یەک بەسەر ئەوی تر هەیەتی. ئەم نامیلکەیەش بریتیە لە (١٠٠) ئامۆژگاری بۆ ئافرەتی خاوەن مێرد کە چۆن بتوانێت ببێت بە خۆشەویسترین کەس لەلای مێردەکەی..؟؟ کە هیوا و ئاواتی هەموو ئافرەتێکە.

(١)

مێردەکەت خۆش بوێت

خۆشەویستیش تەنیا

قسە نیە.

بەڵکو کردارە...

خۆشەویستی

دەستکەوت نیە.

بەڵکو بەخشینە.

(٢)

بەردەوام گوێڕایەڵی

مێردەکەت بە لەوەی

کە خودا لێی ڕازیە...

وەئەگەر ناچاری

کردی سەرپێچی مەکە

تەنها لە شتێك نەبێ

کە خودا تورەبکا.

(٣)

پارێزگاری بکە لە
نهێنیەکانی
مێردەکەت و
نهێنیەکانی ماڵەوەت
هەتاکو لای نزیکترین
کەست.

(٤)

ڕێگە بە کەس نەدەیت

هەر چەند لێتەوە نزیک

بێت نێلەڵ بە زمانت

بێت...

چونکە زمانتان ئەنها

موڵکی خۆتانە.

(٥)

بەردەوام
خۆت جوان بکە بۆ
مێردەکەت...
ئەنها بۆ ئەو
بۆ خەڵک نا.

(٦)

کەس و کاری

مێردەکەت خۆش بوێت
و ڕێزیان لێ بگرە ئەویش
خۆشتی دەوێ...
وە بانگی باوکی بکە بە
(باوکە) وە دایکی بە
(دایکە).

(٧)

چارەسەری هەموو
گرفتەکانت بکە لە
ژووری نووستن کە تۆ لە
ئامێزبدای...وە گرنگی بدە
بە گفتوگۆی سەرجێگا.
چونکە بەهۆیەوە
ئەوەی لەناودڵە
نامێنێ.

(٨)

لەگەڵ مێردەکەت
بژی بە گوێرەی توانای
ماددی و دارایی ئەو...
ئەگەر توانای دارایی
هەرچەند بوو.

(٩)

بەهیچ شێوەیەک درۆ
لەگەڵ مێردەکەت
مەکە. هەتا ئەگەر
درۆی سپیش بێت...
وە هیچ شتێکی لێ
مەشارەوە.

(١٠)

ئافرەتی زیرەک
بەرامبەر مێردەکەی
ناوەستێتەوە لە کاتێک
کە ئەو تووڕەیە
وازی لێ بێنە تاکو بە
تەواوی ئارام دەبێتەوە
پاشان باری خۆتی
لەگەڵ دەست پێ بکە.

(١١)

پیاو ئافرەتی
سەرسەخت (عیناد)ی
خۆش ناوێت...
پێداگیری لەسەر
رەئیەکانت مەکە
هەرچەند ڕەئیەکەت
ڕاست بێ.

نەکەی گلەیی لە
مێردەکەت بکەی
لەلای یەکێکی تر
هەرچەند ئەو کەسە
لێتەوە نزیکیش بێت.

(١٣)

باوەڕ بە کەس مەکە
تەنها بەوانە نەبێت
کە مێردەکەت
خۆشیانی دەوێ و
پێیانەوە ئارامە.

(١٤)

زۆر لە تەلەفۆن قسە

مەکە...

چونکە سەرەڕای

تێچوونی دارایی، قسەی

زۆر کات بە فیڕۆ

دەدات و هەڵە دروست

دەکات.

(١٥)

زوو بخەوەو زووش

هەڵسە...

چونکە بەرەکەت لە

زوو لەخەو هەڵسانە

وەنووستنی تەواو

باشترین چارەسەرە بۆ

تەندروستی لەش و

جوانی دەم و چاو.

وا بلە بەردەوام
ئایەتەکانی خوای گەورە
لەناو ماڵ ببیسترێ. بە
تایبەت کاتێك
مێردەکەت لەماڵ نیە.
چونکە ئەو ماڵەی
ئاوەدان بێت بە قورئان
فریشتەکان دایدەپۆشن و
شەیتان نزیکی
ناکەوێتەوە

(١٧)

ڕێز لە مێردەکەت بنێ و

پلەی خۆی بدەری و

شانازی پێ بکە...

وە بەردەوام پارێزگاری

لە پابە و

هەڵسوکەوتەکانی بکە

لە بەرامبەر هەموو

خەڵك.

(١٨)

کاتی خۆت بەردەوام

بە فیڕۆ مەدە بەرامبەر

تەلەفزیۆن

بەڵکو بەیەکەوە

کەمێک سەیری بکەن.

وە هەوڵ بدە شتێک

بکەیت لە کاتی سەیر

کردنەکە.

هەموو شتێك بكە بۆ

ئەوەی ڕێز لەبەگلرتن

زمانی گفتوگۆنان بێت.

وای لێ بكە ڕێزت لێ

بنێت..وە بە هیچ

شێوەیەك قسەی نا

شیاوو جوێنی پێ نەدەی

ئەگەر هاتوو بە

گالتەش بێت

(٢٠)

بە هیچ شێوەیەك لە
ماڵ دەرنەچی تەنها بە
مۆڵەتی مێردەکەت
نەبێت. هەتا ئەگەر
دەرچوونەکەش بۆ کار
بێت.

سووربە لەسەر ئەوەی

کە مێردەکەت کەس و

کاری تۆی خۆشبوێ و

ڕێزیان بگرێ بە تایبەت

دایك و باوك و برا و

خوشك یاشان خزمە

نزیکەکانت.

هیچ شتێکی لێ مەشارەوە
هەتا ئەگەر بچووکیش
بێت. چونکە ئەوەی
بچووک بشارێتەوە
گەورەش دەشارێتەوە
بۆیە ڕاشکاوی و بێ
پەنهانی با دراوێک بێ
لە نێوانتان ئالوگۆڕی پێ
بکەن.

(٢٣)

بۆ مێردەکەت ببە بە
دایکێك لە بەزەیت
بۆی لە ماڵەوە...
وە بە هەست و
سۆزیشت ببە بە
خۆشەویستی.

(٢٤)

لە کاری ماڵەوەت
تەواوبە پێش
گەڕانەوەی
مێردەکەت بە نیو
کاتژمێر.

(٢٥)

گرنگی بدە بە هەندێ

ووردەکاری کە ژیان

دروست دەکات...

بۆ نموونە پێی بڵێ

بەیانیت باش یان ئێوارە

باش. یان سوپاس بۆ خوا

کە سەلامەتی.....هتد.

(٢٦)

چەندی لە تواناتـ

هەبە ڕوو خۆش بە

چونکە پیاو بە هیچ

شێوەیەک هاوسەری

بە گۆنە گۆتـ و

ڕەخنە گری خۆش ناوێ.

(٢٧)

خوا حافیزی لە
مێردەکەت بکە بە ماچ
و پێشوازیشی بکە هەر بە
ماچ...
با ئەو کارە ببێتە
خویەکی جوان لە
نێوانتان.

(٢٨)

بەلایەنی کەم لە
هەفتەی جارێک
سەردانی کەس و کاری
خۆت و مێردەکەت بکە
تا ببێتە خوبەکی جوان
هەردوو خێزان چاوەڕێی
بکەن.

بەهیچ شێوەیەك خۆت و
مێردەكەت لە شوێنێكی
دوور لە یەك مەخەون
هەتا ئەگەر لە یەكیش
زویر بن. چونكە بەر
یەككەوتن گەرمی لە
نێوانتان دروست دەكات
كە ئەویش خۆشەویستی
دروست دەكات.



(٣٠)

پێویستە لە قسە کردن
لەگەڵ مێردەکەت
دەنگت ناسک بکەیتەوە.
چونکە بەمە
سەرنجی مێرد بۆ خۆت
ڕادەکێشی.

(٣١)

ئەگەر لەگەڵ

مێردەکەت لەسەر

شتێك جیاوازیتان هەبوو

با ڕەئی کۆتایی بۆ ئەو

بێت.

تەنها ئەگەر هاتوو

توانیت ڕازی بکەیت.

هەموو مانگێك بڕە
پارەیەك لە
مەسروفاتتان هەڵگرە
هەتا ئەگەر کەمیش
بێت،
چونکە ئەو ماڵەی زیاد
نەکات کەم دەبێت.

(٣٣)

سەرسامی خۆت پیشان

مەدە بە شتانێك كە

مێردەكەت توانای

كڕینی نیە

تاوەكو هەست بەوە

نەكات كە ناتوانێ

داواكاریەكانت

جێبەجێ بكات.

(٣٤)

بەپەلە وەلامی
مێردەکەت بدەوە
کانێک بانگی کردی بۆ
سەر جێگا.

(٣٥)

چەندی پێت دەکری

دەنگ بەرز مەکە

چونکە پیاوان هەموویان

ئافرەتی دەنگ بەرزیان

خۆش ناوێ.

(٣٦)

لە هەندێ شتی بچووک
بەشداری بکە لەگەڵ
مێردەکەت...
بۆ نموونە کە دەردەچن
با لە نێوانتان نهێنیەکی
تایبەت هەبێ بە
جۆرێک جگە لە تۆ و ئەو
کەسی تر پێی نەزانێت.

(٣٧)

بەرامبەر مێردەکەت

سەرسوڕمانی خۆت بە

هیچ پیاوێکی تر نیشان

مەدە. با ئەو پیاوەش

کەسایەتیەکی گشتی

بێت وەکو هونەرمەند

یان وەرزشوان یان سیاسی

و...... هتد بێت.

(٣٨)

لە بەهای هیچ
ڕەئیەکی مێردەکەت
کەم مەکەوە لە پێش
خەڵکانی تر
هەتا ئەگەر هاتوو
لەسەر هەڵەش بێت
یان ڕەئی جیاوازت
هەبوو.

(٣٩)

سوور به له سه ر ئه وه ی

که مێرده که ت له

ماڵه وه نان بخوات.

وه له دروستکراوی

ده ستی تۆ بخوات.

(٤٠)

هەوڵ بدە کە پێش

مێردەکەت لە خەو

هەڵسی.

وە ئەگەر وبستت

بخەوبتەوە دوای

دەرچوونی ئەو بخەوە.

(٤١)

دۆلابی مێردەکەت

بە جوانترین شێوە

ڕێک بخە.

(٤٢)

هەوڵ بدە لە هەموو

شتێك كە مێردەكەت

دەبەوێت حاڵی بی

ئەگەر تەنها بە سەبر

كردنیش بێ.

(٤٣)

سوور بە لەسەر
گرنگبدان بەو بۆنانەی
کە پەیوەندی بە
مێردەکەت هەیە
بۆ نموونە ڕۆژی لە
دایکبوونی، وەڕۆژی بە
هاوسەر بوونتان........هتد.

(٤٤)

بە هیچ شێوەیەک
گفتوگۆی تەلەفۆنی
لەگەڵ مێردەکەت
تەکەی کاتێک لەسەر
کارە.

(٤٥)

منەنبارى خۆت نیشان

بدە بۆ مێردەکەت لە

هەر شتێك کە لە پێناو

تۆ و ماڵەوەت دەیکات

هەتا ئەگەر ئەو شتە

بچووکیش بێت.

(٤٦)

لە هەندێ شتی بچووك

بەشداری مێردەکەت

بکە هەتا ئەگەر

سەیر کردنی

تەلەفزیۆنیش بێ.

(٤٧)

بودجەیەك بۆماڵەوە
دابنێ بەهاوکاری
مێردەکەت بەجۆرێك
هەموو خەرجیەکان
لەخۆ بگرێت.

(٤٨)

بە هیچ شێوەیەك بە
ڕابردووی مێردەکەندا
مەچۆوە
وە ڕێگە نەدەی کە
باسی ڕابردووی تۆش
بکات.

(٤٩)

هەندێ ووشە و

هەڵسوکەوتی تایبەت

بە خۆتان دابهێنە کە

جێگای خۆشی و

زەردەخەنە بێت.

(٥٠)

هەندێ شت لە
مێردەکەت داوا بکە کە
حەزی لێ دەکەیت
بۆ نموونە بڵێ پێم باشە
قژت وا چاک بکەی یان
بەم شێوەیە
جوانی ........ هتد.

(٥١)

شەرم و شلۆقاجی
سەری ئافرەتە
پیاو ئافرەتی بێ چاو و
ڕووی خۆش ناوێ.
بە پێچەوانەوە حەز بە
شەرمنی دەکات.

(٥٢)

پاك و خاوێنی

ماڵەکەت بە خاوێنی

گەرماو و چێشتخانە

دەست پێدەکات

کەوانە سوور بە لەسەر

خاوێن ڕاگرتنیان بە

باشی.

(٥٣)

بە دریژایی کات پشت

مەبەستە بە پەکێک تا

لە کاری ماڵەوە

یارمەتیت بدات و

کارت لەگەڵ بکات.

(٥٤)

لە کاتێک کە
مێردەکەت لە ماڵ نیە
ئاگاداری گفتوگۆت بە
لەگەڵ فرۆشیارانی بەر
دەرگا و زۆر دەرگایان بە
ڕوودا مەکەوە.

(٥٥)

زیاد لە پێویست لەگەڵ
دراوسێکانت تێکەڵاو
مەبە.

(٥٦)

لەگەڵ کەسی نزیکی

مێردت گفتوگۆ بکە

هەتا ئەگەر بە

تەلەفۆنیش بێت بە

تایبەت ماڵی مام و پور و

خاڵ.

(٥٧)

پەیوەندیەکی گەرم و
گوڕ دروست بکە لە نێوان
دایکت و مێردت بۆ
ئەوەی پەیوەندیەکان
تەنها بریتی نەبن لە
ناسیاوی و سەردانێکی
سادە.

(٥٨)

پێویستە هەموو ساڵێک

شتێکی نوێ لە ژیانت و

لە ماڵەوەت زیاد

بکەیت.

(٥٩)

ئاگاداربە!

ترسناکترین ساڵی

هاوسەری ساڵی

یەکەمە. پاشان پێنج

ساڵی دواتر.

(٦٠)

ڕووداوو کارەساتی
ناخۆش بۆ مێردەکەت
لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان
نەخوێنیتەوە.

(٦١)

زۆر خوێ بە خواردن

خەریک مەکە لە

کاتێک مێردەکەت لە

ماڵە.

(٦٢)

سوور بە لەسەر
کانەکانی نووسنی
مێردەکەت چونکە پیاو
ئەگەر خەوی کەم بوو
هۆشی لە دەست
دەدات.

(٦٣)

بارمەتی مێردەکەت
بدەلەو شتانەی
پەیوەندی بە
کارەکەی یان خوێندنی
هەیە ئەگەر بۆ ئەمە
داوای لێکردی.

(٦٤)

داوای پارمەتی لێ بکە
ئەگەر تۆ لە
قوتاغەکانی خوێندنی
تاهەست بە گرنگی
بکات.

(٦٥)

بە تەنیا بڕیار مەدە و

پاشان پێی ڕابگەیەنی..

بەڵکو

بەشداری پێ بکە

لە دەرکردنی بڕیارەکان.

(٦٦)

لە کاتی لەبەر کردنی

جل و بەرگ

بۆ دەرەوە یان بۆ هەر

بۆنەیەک

ئەوا پرس و ڕای پێ بکە.

(٦٧)

بۆ هەر ئاهەنگێك

ئەوقات و جلەی بۆ

هەڵبژێرە

کە لەبەری دەکات.

(٦٨)

هیچ بنەمایەك بۆ

پەیوەندیە

تایبەتیەكانتان دامەنێن

باشترین بنەما ئەوەیە

كە هیچ بنەمایەك

نەبێت.

(٦٩)

بەشداری پێبکە لە

هەندێ شتی بچووک.

بۆ نموونە لە

دروستکردنی زەلاتە

یان

ڕێکخستنی گەشت.

(٧٠)

واچاکە

بەشداری لەگەڵ

بکەی لەووەرزشەی

ئەنجامی دەدات.

(٧١)

بەردەوام

هانی بدە بەرەو

پێشکەوتن

لە کارەکەی.

(٧٢)

زۆر لەلای ئەو

باسی سەرکەوتنی

مێردی هاوڕێکەت

مەکە

لە کارەکەی.

(٧٣)

ئەگەر نووشی هەر

ناخۆشیەك هات بۆ

نموونە پێكدادانی

ئۆتۆمبێل و..........

ئەوا هەوڵ بدە

ئازارەكەی لەسەر

كەم بكەیتەوە.

(٧٤)

خۆپەرست

مەبە.

(٧٥)

هەوڵ بدە خۆڕابهێنی
لەسەر ئەو شتانەی
حەزی لێ دەکات.
وەڕای بهێنە لەسەر
ئەو شتانەی تۆ حەزی
لێ دەکەی.

(٧٦)

لە بەرامبەری ئەو

خۆت بە بێ هێز

بەرامبەر

ئارەزووەکانت نیشان

مەدە.

(٧٧)

ئەگەر لە مێردەکەت

تووڕە بوی ئەوا لە کاتی

تووڕە بوونەکە

لێبێبچینەوەی لەگەڵ

مەکە.

(٧٨)

ئەگەر مێردەکەت لەو

کەسانەیە کە هەست

و سۆزی خۆی

دەشارێتەوە

ئارامی لەسەر بگرە تا

خۆی ئارەزوو دەکات

بیدرکێنێ.

(٧٩)

ئەکەی لەگەڵ

هاورێکانت ڕووخۆش و

سادەبی و

لە ماڵەوەش لەگەڵ

مێردت خۆت گران

نیشان بدەی.

(٨٠)

بە هیچ شێوەیەک

باسی چیرۆکی تەلاق

مەکە

ئەگەر خوا نەخواستە

لە هاوڕێیەکت

ڕوویدا.

(٨١)

لەگەڵ میوان سادەو

ساوپلکە مەبە

هەتا ئەگەر

کەس و کاری خۆشت

بن.

(٨٢)

داخ هەڵمەکێشە

بۆ ڕۆژانی خۆشبت کە

لەماڵی باوکت

بەسەرت بردووە.

(٨٣)

کانێك مێردەکەت لە

گەرماو بێت بەسەربدا

مەچوو

تەنها ئەگەر خۆی

داوای کرد.

(٨٤)

زیادەڕۆیی مەکە
لە شانازی کردن بە
کەس و کارت
وەکو خوشک و برا و مام
و پور و خاڵ.

(٨٥)

ئەگەر بانگ کرای بۆ

بۆنەیەک ڕاسنەوخۆ

ڕازی مەبە بەڵکو بلی

بارەئی مێردەکەم

وەرگرم و لەبارودۆخی

ئاگادار بم.

(٨٦)

پیاو ئافرەتی زۆر بلێی

خۆشناوی

بۆیە بە زمانی چاو

گفتوگۆ بکە زیاتر لە

زمانی ووشە.

(٨٧)

بەلابەنی کەم هەموو
ڕۆژێك ڕۆژنامەیەك و
هەفتانەش گۆڤارێك
بخوێنەوە تاوەکو
ئاگاداری بارودۆخی
دونیا بیت.

(٨٨)

بە هیچ شێوەیەك
گلەیی لە مێردەکەت
مەکە و داوای هیچ
شتێکی لێ مەکە لەو
کاتە ناسك و خۆشانەی
کە لەگەڵ یەکن.

(٨٩)

خۆت هەڵسە بە
داخستنی دەرگا و
پەنجەرەو گرتنەوەی
ئاو و غازیماڵەکەت
هەموو شەوێك وە پێش
هەر دەرچوون یان
گەشتێك.

(٩٠)

باسی پلانی داهاتووی

خۆتان بە هیچ

شێوەیەك لای كەس

مەدركێنە با ئەو كەسە

هەركێ بێت.

(٩١)

پارێزگاری

لەنوێژەکانت

بکە.

(٩٢)

باوەڕ بەم ووتەیە

مەکە کە دەڵێن

هاوسەرگیری

گۆڕستانی خۆشەویستیە

بەڵکو پێچەوانەکەی

ڕاستە

خۆشەویستی گڕ دەگرێ

دوای هاوسەرگیری.



(٩٣)

هەوڵبدە ناوی شیاو

بۆ منداڵەکانت

هەڵبژێری.

(٩٤)

هەرگیز لە ووتەکانت

یان لە پەیوەندیت بە

مێردت لە پێش کەسانی

ترسادەمەبە.

(٩٥)

مانگی جارێك له پشووی

کۆتایی هه‌فته‌ به‌

لابه‌نی که‌م گه‌شتێك

له‌گه‌ڵ مێرده‌که‌ت بکه‌

بۆ هه‌ر شوێنێك بێ.

(٩٦)

بەشداری لەگەڵ

بەکتر بکەن لە حەز

لێبوونی هەندێ شت

بۆ نموونە گۆرانیەکی

دیاری کراو یان ڤدیۆ

کلیپێک یان فیلمێک.

(٩٧)

باوەڕ مەکە

کە هاوسەرگیری

جێژنێکی ئامادەکراوی

ئەندروستە بەلام

بەتام نیە...

بەپێچەوانەوە

بەتامترین شتە.

باوەڕ بەم پەندەی
مانابانەی گۆڤارەکان
مەکە کە
هاوسەرگیری شەڕێکە
و دەربازبوونی نیە.
نەخێر...
بەڵکو هاوسەرگیری
بەندایەتی و ڕۆژی و
ژیانی تەواو نیعمەتە.

(٩٩)

باسی خۆشی خۆت
لەگەڵ مێردەکەت یان لە
ماڵەوەت لای هیچ
کەس مەکە.

(١٠٠)

باوەڕ مەکە کە ژیانی
هاوسەری چیرۆکێکی
خۆشەویستی ڕۆمانسیە.
نەخێر...
ژیانی هاوسەری کاری
بەردەوام و ژیان و
هەوڵدانە لە پێناو
سەرکەوتن.

خۆشەویستی تەنیا قسە نیە،

بەڵکو کردارە...

خۆشەویستی دەستکەوت نیە،

بەڵکو بەخشینە.

ئەم نامیلکەیە:

- پێکهاتووە لە 100 نامۆژگاری بۆ ئەو کچانەی کە دەیانەوێت ژیانی هاوسەری پێک بهێنن تا ببێتە بەرچاو ڕۆشنی بۆ داهاتوویان.
- بۆ ئەو ئافرەتانەی کە دەیانەوێت بەختەوەری و خۆشەویستی مێردەکانیان بە دەست بێنن.
- خوشکی بەڕێز...جێبەجێ کردنی خاڵەکانی ئەم نامیلکەیە بە وردی یارمەتی دەرت دەبێت تا چێژی زیاتر لە ژیانی هاوسەریت وەربگری و بەختەوەری هەمیشەیی بەدەست بێنیت.

